حکومەتا هەرێما کوردستانێ - عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
رێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# پەروەردەیا ئیسلامی

## بۆ پۆلا ئێکێ بنەڕەت

**دانانا**
عبدالله عبدالرحمن عبدالله        فاروق محمد علی عباس
صادق عوثمان عارف

**پێداچوونا زانستی**
د. بشیر خلیل توفیق        ابوبکر علی کاروانی

**وەرگێران**
حسن محمد شریف

**بژارەکرن و پێداچوونا زمانی**
ئیسماعیل تاها شاهین

چاپا ئێکێ        ٢٧١٥ کوردی        ٢٠١٥ زایینی        ١٤٣٦ مشەختی

## ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان

# پێشەکی

وەزارەتا پەروەردەیێ یا حکومەتا هەرێما کوردستانێ ڕژدە ل سەر پێشکێشکرنا باشترین پرۆگرامان بۆ قوتابییان ل کوردستانێ، ژ بەر هندێ بڕیار هاتە دان ژ وەزارەتا پەروەردەیێ و ب فەرمانا ڕێزدار وەزیرێ پەروەردەیێ بۆ دانانا پرۆگرامەکێ نوو بۆ بابەتێ پەروەردەیا ئیسلامی کو یێ گونجایی بت د گەل سیستەمێ نوو یێ پەروەردەیێ، ئەوێ کو د ناڤ کۆنگرەیێ پەروەردەییدا بڕیار پێ هاتییە دان. و لیژنەیەکا تایبەت هاتە دانان بۆ ڤێ مەرەمێ، ژ بۆ کو پرۆگرامەکێ نوو یێ گونجای د گەل ژییێ قوتابیان ل هەمی قۆناغێن خواندنێدا، و د گەل بەرچاڤگرتنا بارێ جڤاکی د کوردستانێدا، و ئەڤ پرۆگرامێ نوو دێ بتە زنجیرەک د گەل پێشڤەچوونا ژییێ قوتابی، چونکی پەروەردەیا ئایینی، وەک ئەم دزانین د چەند قۆناغاندا دەرباز دبت و ل دووڤ ئێک، دێ پێناسەیا ئایینێن دی ژی ب خوەڤە گرت. پرۆگرامێ پۆلا ئێکێ پێنگاڤا ئێکێیە د ڤی کاروانیدا، ئەوێ کو هیڤییا سەرکەڤتنێ بۆ دخوازین، و ل ڤێرێ دەورێ مامۆستایێن خوەشڤی دێ ئێتە دیارکرن، بۆ پێشکێشکرنا وی ب ڕەنگەکی کو ئارمانجێن خوە ب جه بینت.

قوتابی د ڤێ قۆناغێدا وەک کاغەزەکا سپییە، هەر تشتەکێ کو مفایێ وی تێدا بت، دێ ل سەر ئێتە تۆمارکرن و دێ ب مفا زڤڕیتەڤە بۆ جڤاکا وی. چونکی ئەو تاک دێ بتە بەرێ بنیاتێ بۆ ئاڤاکرنا جڤاکەکا پێشکەڤتی.

و دێ بانگەوازێ ئاراستەی مامۆستایێن ڕێزدار کەین کو ب پشتڕاستی و دلسۆزیڤە ڤی کارێ پیرۆز ئەنجام بدەن و ئەو هەردەم جهێ باوەرییێنە.

و مە ب فەر زانی کو ئەم ڤی پرۆگرامی ل سەر ئاوایێ چیرۆکان دانین، چونکی قوتابی د ڤێ قۆناغێدا حەز ژ ڤی ئاوایی دکەت، و ئەڤە ئاوایەکی نوویە د پەروەردەیێدا، و مە مفایا ژ ڤێ وەرگرتی ل تاقیکرنێن وەلاتێن دەوروبەر، و ب ڤی ڕەنگی وانەیا پەروەردەیا ئیسلامی دێ بتە وانەیەکا سەرنجڕاکێش کو قوتابی هشیار بن ل سەر فێربوونا هەر چییێ تێدا ژ فێرکرن و ڕەوشت و ڕێنمایان، چونکی دێ ب ئاوایەکی سەرنجڕاکێش و دلخوەشکەر ئێتە ئامادەکرن بۆ قوتابییان. و پێدڤییە ل سەر مامۆستایێن ڕێزدار دەورێ وان کەساتییێن د ناڤ چیرۆکێن ڤێ کتێبێدا بدەتە قوتابییان، دا کو ئەو زانیاری و مەبەست ببنە ئارمانجێن ئێک وانەیێ و ل دەڤ قوتابییان بچەسپن و بنەجه ببن.

و خودێ پشتەڤانێ مە هەمییانە

**لیژنەیا دانانێ**

## وانەیا ئێکێ

# خودێ خودانێ مەیە
# خودێ دورستکەرێ مەیە
# خودێ دورستکەرێ هەر تشتەکێیە



ئەسمان



ئەرد

# خودێ ساماندەرێ مەیە



بـــاران



زەڤی

## خودێ خودانێ خوەشی و کەرەمان

خودێ خودانێ منە .. خودێ خودانێ منە

خودێ دورستکەرێ منە .. خودێ سامانده‌رێ منە



سفره

# موحەمەد (سلاڤێن خودێ لێ بن) پێغەمبەرێ مەیە

ئەو هنارتییێ خودێیە

## موحەمەد (سلاڤ لێ بن)

ئەو ڕاستگۆیێ دەستپاکە

ئەو خوەشڤییێ پشتەڤانە

ئەو دلۆڤانییە بۆ خەلکێ جیهانێ

وانەیا سێیێ

# ئیسلام ئایینێ مەیە

## ئیسلام ئایینێ ئێکتاپەرێسییێیە



ئیسلام ئایینێ ئاشتی و تەناهییێیە

# ئایینێ ئازادییێ و ڕێزگرتنا مرۆڤی

## ئایینێ کاری



کارگەه



زەڤی



کارکەر



بازاڕێن بازرگانییێ

# ئایینێ زانست و زانیارییێ




کتێب




قەلەم



قوتابخانە








زانكۆ







فڕۆكە





گەمی ؛ گەشتی



## وانەیا چارێ

# قورئان کتێبا مەیە

قورئان ئەو پەیاما خودێیە بۆ هەمی مرۆڤاتییێ



قــورئان

پەرستن

سزا

چیرۆك

بەرنامەیێ ژیانێ

تێدایە

وانەیا پێنجێ

# ستوونێن ئیسلامێ

## ١- هەردوو شەهادە

أَشْهَدُ أنلاإِلَهَ إِلاَّ الله

وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ الله

ئەز شاهدەییێ ددەم کو خودێ ب تنێ خودێ و خودانە و ئەز شاهدەییێ ددەم کو موحەمەد پێغەمبەرێ خودێیە



## ٢- نڤێژ

## ٣- زەکات

## ٤- ڕۆژیگرتنا ڕەمەزانێ

## ٥- حەجکرنا مالا خودێ بۆ کەسێ بشێت

# ستوونێن باوەرێ

١- باوەریئینان ب خودێ.

٢- باوەریئینان ب ملیاکەتان.

٣- باوەریئینان ب پێغەمبەران.

٤- باوەریئینان ب کتێبێن پیرۆزێن ئەسمانی.

٥- باوەریئینان ب ڕۆژا دووماهییێ.

٦- باوەریئینان ب قەدەرێ چ باش چ ژی خراب.

# باوەرییا مە ب کتێبێن پیرۆزێن ئەسمانی

زەبوور...خودێ بۆ پێغەمبەرێ خوە (داوود) (سلاڤ لێ بن) ئینا خوارێ.

سوحوف... خودێ بۆ پێغەمبەرێ خوە (ئیبراهیم) (سلاڤ لێ بن) ئینا خوارێ.

تەورات..خودێ بۆ پێغەمبەرێ خوە مووسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ئینا خوارێ.

ئنجیل.. خودێ بۆ پێغەمبەرێ خوە (عیسای) (سلاڤ لێ بن) ئینا خوارێ.

قورئان کو کتێبا مەیە ...... خودێ بۆ پێغەمبەرێ مە (موحەمەد) (سلاڤ لێ بن) کو دووماهیك پێغەمبەرە، ئینـــا خوارێ.

# هندەك نموونە ژ نیشانێن دەستکرد



سیمێ ئالیایی



سێگۆشەیا سۆر



بەرەکێ بۆیاغ کری ب ڕەنگێ سۆر



ستوونەکا سۆر



کەلۆك ؛ کەلەك



ئالایەکێ سۆر

**ل هەر جهەکێ ڤان نیشانان ببینی، بزانە ل پشت وێرێ جهەکێ مین کرییە، و دوور نینە بەفر و بارانێ هندەك ژ وان مینان ئینابنە پێش، هیڤی دکەین نێزیکی ڤان جهان نەبن.**

# چو جاران نێزیکی نیشانێن مینان نەبە، چونکی دێ تە بەرهنگاری ترسێ کەن.




سێگۆشەیا سۆر



ئالایێ سۆر




بەرێ بۆیاغ کری ب رەنگێ سۆر BM ل سەر نڤیسییە



کەلەکا بەران

## مین و تەقەمەنی هەمی مرۆڤی دکوژن
## یان ژی بریندار دکەن

### مینێن دژی مرۆڤی



### مینێن دژی تانك و زریپۆشان



# نموونە ژ هێمایێن دەستکرد









## ڕێزگرتنا دەیبابان



**خودێ گۆتییە: (وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا)**

**ئانکو (د گەل دەیبابان باش بن)**

**پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يُوَقِّرْ كَبِيْرَنَا وَيَرْحَمْ صَغِيْرَنَا).**

(ئەو نە ژ مەیە ئەوێ قەدرێ مەزنێ مە نەگرت و دلۆڤانییێ ب زاڕۆك و بچووكێ مە نەبت).

**مامۆستا**: سپێدەیا وە باش قوتابییێن من یێن خوەشڤی.

پێدڤییە هوون باش گوهێ خوە بدەنە شیرەتێن دەیبابێن خوە و هوون قەویاتییێن وان ب جە بینن چونکی دێ بەرێ هەوە دەنە ڕێکا ڕاست د ژیانێدا.

ئازاد قوتابییەکێ زیرەك بوو ل پۆلا ئێکێ

گوهدارییا شیرەتێن دەیبابێن خوە دکر و پێگیری ب وان شیرەتان دکر.

پاقژ دهاتە قوتابخانەیێ.

**شیلان:** سازان ژی قوتابییەکا گوهدارە و شیرەتێن دەیباب و مامۆستاییێن خوە ب جهـ دئینت.

**سیروان:** بەلێ سازان جیرانا مەیە و قوتابییەکا گوهدار و خوەشڤییە ل مال و قوتابخانەیێ.



خودێوۆ تو دەیبابێن من بپارێزی

## بزاڤ و چالاکی:

پێدڤییە قوتابی بەحسێ ڕەفتارێن خوە بکەن د گەل دەیبابان د مالدا.

**دوعا:** خودێوۆ دەیبابێن من بپارێزی.

# قوتابییێ ڕاستگۆ



**خـودێ دبێژت :** ﴿ يَأَيُّهَا الَّذِيْنَ آمَنُوا إِتَّقُوا اللهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِيْنَ﴾

( گەلی باوەرداران خودێ بپەرێسن و د گەل کەسێن ڕاستگۆ بن ) **پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت:** ( عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَأَنَّ الصِّدْقَ يَهْدِي إِلَى الْبِرِّ)

( ئەمانەت هوون و ڕاستی ، چونکی ڕاستی بەرێ مە ددەتە قەنجییێ).

مامۆستا چوو د پۆلێڤـه ، و دیت کو پەنجەرەیەك هاتییە شکـاندن .

**ئینا گۆتە قوتابییان :** کێ پەنجەرە شکاندییە ؟

بێ دەنگی کەڤتە پۆلێ ، و ژ نشکەکێڤە سامان ڕابوو و گۆت :

من پەنجەرە شکاندییە مامۆستا !

قوتابی ژ زیرەکییا (سامان ) گوهشی مان ، کو خەلەتییا خوە هەقاند و خوە ژ بەر نەهاڤێت .

مامۆستایی **بسیار ژێ کر :**

چ وە ل تە کر تو ڕاستییێ بێژی و درەوێ نەکەی؟

**سامان:** مامۆستا درەو حەرامە ، هەر وەکی تە نیشا مە دایی، و نابت مرۆڤێ موسلمان درەوێ بکەت.

**مامۆستا :** ئافەرین کوڕێ من ، ڕاستگۆیی جوانترین ڕەوشتە و درەو کرێتترین ڕەوشتە. پێغەمبەرێ مە(سلاڤ لێ بن) دبێژت : (( ئەمانەت هوون و ڕاستی، هندی ڕاستییە ڕیکا قەنجیبێیە، و هندی قەنجییە ڕێکا بەهەشتێیە )) ڤێجا پێدڤییە ئەم ڕاستگۆیین د گەل هەمی خەلکی و ئەم نەترسین ژ گۆتنا ڕاستییێ، کوڕێ من چونکی تە خەلەتییا خوە هەڤاند و تە ڕاستی گۆت من تو عەفوو کری ل سەر شکاندنا پەنجەرەیێ.

**چالاکی:**

بەرسڤا ڤان پسیاران بدە :

١- چ ڕوودا بوو د پۆلێدا؟

٢- ئەرێ سامانی ڕاستی گۆت؟

٣- ژ بەر چ مامۆستا ل سامانی بۆری ؟

**ڕاهێنان:**

مامۆستا دێ چیرۆکا (مەلەڤانێ درەوکەر) وەك کورتە زارڤەکرن بۆ قوتابییان بێژت و ڤەگێرت.

ڤی دەقی دێ ڕەنگ کەم

ڕزگار بوون دگۆتنا ڕاستییێدایە

## دەستپاکییا پالەیەکێ(کارکەرەکی )



کارکەرەکێ دەستپاک

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د سالۆخدانا مرۆڤێ دوڕوودا دبێژت :

# (إِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)

## ( ئەگەر باوەری پێ هاتە ئینان ، دێ خیانەتێ کەت )

بابێ یەشاری پالەیێ ئاڤاهییان بوو، ب ڕژدی و مجداهی کار دکر ، دا پارییەکی حەلال بۆ مالا خوە بینت، و د سەر دەستکورتی و بەلەنگازییا خوەڕا نموونەیەکی جوان بوو بۆ دەستپاکی و ڕەوشتپاکییێ . و سپێدەهییەکێ دەمێ ل مالەکێ کار دکر، چزدانکەکا بچووك دیت، دەمێ ڤەکری دیت هندەك پارە تێدانە، دەمێ هەڤالێن وی زانین، داخواز ژێ کرن، کو د ناڤبەرا خوەدا وی پارەیی لێکڤە بکەن، لێ بابێ

یەشار ل بەر نەهات و ڕازی نەبوو و گۆت : ئەڤ ماله، ئەمانەته و نه ملك و مالێ كەس ژ مەیه و دڤێت ئەم ل خودانی بزڤڕینین.دەمێ خودانێ مالێ نیڤرۆ هاتییه سەر كاری، بابێ یەشاری چوو دەڤ و چزدانكا پارەیی دایێ ، كابرا حێبەتی ما ژ دەستپاكی و ڕاستگۆییا وی ، چونكی پارە وەكی خوە مابوو.كابرایی سوپاسییا بابێ یەشار كر و ڤیا خەلات بكەت ب هندەك پارەیی، هەمبەر ڤی كارێ وی، بەلێ بابێ یەشار ڕازی نەبوو و گۆت: ئەز سوپاسییا ته دكەم، ئەڤه ئەركه ل سەر مه، و پارستنا ئەمانەتێ ژ ئەركێن ئایینێ پیرۆزێ مەنه.پشتی خودانێ مالێ دەستپاكییا ڤی كاركەرێ ڕەوشتباش دیتی، گۆتێ: من بڕیار ژ ئەڤرۆ پێڤه ته وەك فەرمانبەر ل كۆمپانییا خوە دامەزرینم و دێ وەك هەڤالەكی دەستپاك و ئەمەكدار د گەل من مینی هندی ئەز هەبم.بابێ یەشار زڤڕی مالا خوە كەیفخوەش و مزگینی دا وان ، كو دەستپاكییا وی هۆیەك بوو كو ڕزگار ببن ژ دەستكورتییێ، وسوپاسییا خودێ كرن ل سەر ڤێ چەندێ.

## ڕاهێنان

١- مامۆستا دێ داخوازێ ژ هندەك قوتابییان كەت ، چیرۆكەكێ یان گفتۆگۆیەكا كورت ل سەر پاراستنا ئەمانەتێ ئامادە بكەن .

٢- دێ بۆ وان بەحسێ فەرمۆدەیەكا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) كەت،ل سەر ئەمانەتێ و پاداشتا مرۆڤێ دەستپاك یان ئەوێ خیانەتێ ل ئەمانەتێ دكەت.

٣- دێ هەردو ستوونان گەهینمه ئێك:

| | |
|---|---|
| ڕاستگۆیی | جانتەیەكا تژی پارە دیت. |
| بابێ یەشار | ئەمانەته |
| كاركەری | ڕاستی گۆت |

٤- دێ فەرمۆدەیا پیرۆز ڕەنگ كەم :

لا إِيمَانَ لِمَنْ لا أَمَانَةَ لَهُ

بێ ئیمانه ئەو كەسێ دەستپاك نەبت

# دلپێڤەیی



قوتابی و مامزەك

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن ) دبێژت :

## (فِي كُلِّ كَبِدٍ رَطْبٍ صَدَقَةٌ)

## ( دلوڤانی برن ب هەر خودان ڕوحەکێ خێرە)

دەیکا (بانۆ) هەر شەڤ بەری نڤستنێ چیڕۆکەکێ بۆ زاڕۆکێن خوە دبێژت.

شەڤەکێ ژ شەڤێن زڤستانێ ئەڤ چیڕۆکە بۆ وان گۆت :

پیرەژنەکێ پشیکەکا بچووك هەبوو. هوون چاوا پشیکێ دبینن، زاڕۆکێن من ؟

**بانۆیێ گۆت :** گەلەك جوانە دادێ ، چاڤێن وێ چەند جوانن !
**و بەهزاد گۆت :** من گەلەك دڤێت دادێ ، کا چیرۆکا وێ تەمام بکە .
**دایکێ گۆت :** بەس وێ ، حەز ژ پشیکا خوە نەدکر ، و ڕۆژەکێ ژێ کەربگرتی بوو و کرە د بنبیڤەکێدا زیندان کر .
**سۆز :** ئۆی ، ئێخسیرێ.
**بانۆ :** بۆ چ هندە یا دلڕەق بوو دادێ؟
**بەهزاد :** پشیکا بێ ئەزمان چ کر ؟
**دایك :** ژ برساندا دکرە گری ، و دگۆت : میاو، میاو
و پیرەژنێ خوارن و ڤەخوارن نەددانێ، بەر ژی نەدا ب خوە بۆ خوە ل خوارنێ بگەڕت.
پشتی چەند ڕۆژەکان دەنگێ پشیکێ پیچ پیچە کێم بوو هەتا مری .
زاڕۆك کەڤتنە خەما مرنا پشیکێ، و گۆتن: بۆچ پیرەژنێ ئەڤە ئینا سەرێ وێ؟ ئەرێ هەمی پیرەژن هۆسانە ؟
**دایك :** نەخێر ، زاڕۆکێن من ، هەمی پیرەژن هۆسا نینن.
پێدڤییە ل سەر مە خوەشڤییێن من ، ئەم دلۆڤانییێ ب گیانداران ببەین و ئەوان ئیزا نەدەین، چونکی ئایینێ مە دلپێڤەیی و دلۆڤانییێیە .

## چالاکی و ڕاهێنان

١- مامۆستا داخوازێ ژ هندەك قوتابییان بکەت، وێنەیێن هندەك گیاندارێن کەهی ئامادە بکەن بۆ وانا بێت.
٢- داخوازێ ژ هندەکێن دی بکەت، ب زار دەنگێن وان گیاندارانڤە بکەن.
٣- قوتابییێن پۆلێ بکەتە سێ پشك : پشکەك حەز ژ گیانداران بکەت ،و پشکەکێ کەرب ژێ ڤەبن ، پشکا سێیێ ژی ، ژێ بترسن، و هۆیێن وان ژی دیار بکەن.

وانەیا دوازدەیێ

# کەرەمێن خودێ و سوپاسییا وی



## (وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ)

## ( وبەحسێ خوەشی و کەرەمێن خودێ بکە)

**مامۆستایا پەروەردەیا ئیسلامی ل سەیرانەکا قوتابخانەیێ پسیار ژ قوتابییان کر و گۆت : هوون چ ل ڤاران دبینن ؟**

**ئەرێ هوون حەز ژ ڤان وێنە زیندەوەران دکەن و هەوە کەیف پێ دئێت ؟**



**سارایێ گۆت:** مامۆستا ، ئەز گەلەك حەز ژ دار و كولیلكان دكەم، چونكی سروشتی تژی جوانی و بێنخوەشی دكەن.

**و بارانێ گۆت:** و ئەز حەز ژ تەرش و كەوال و پێرهان دكەم، چونكی دەنگێ وان ل من خوەش دئێت، و ئەم مفایی ژ بەرهەمێن وان دبینین.

**و هندەكێن دی گۆت:** ئەم حەز ژ بالندە و پەلاتینكێن جوان دكەین، ئەوێن مشە ل ڤاران هەین و ب ئاوازێن خوەیێن خوەش مە كەیفخوەش دكەن. ڕێڤەبەرێ قوتابخانەیێ ژی گۆت: ئەزێ پشكدارییێ د خوەشییا هەوەدا كەم ، و دێ بێژم: ئەو ئاڤا د كانی و جۆك و ڕۆباراندا، هۆكار و ئەگەرێ ڤێ هەمی جوانی و خوەشییێ ئەوە، و ئەو بناخەیا ژیانێیە، ژ بەر هندێ ، پێدڤییە ئەم دەرێژییێ د كارئینانا وێدا نەكەین و گلێشی نەهاڤێینە تێدا.

**هەمییان گۆت:** سوپاس بۆ خودێ ل سەر ڤان خوەشی و کەرەمان. هەمی ژ بۆ مەنە و دخزمەتا مەدانە، و پێدڤییە ئەم هەڤال بین د گەل ژینگەهێ و زیندەوەر و چێکرییان.ئەوێن هەمی پێکڤە چاڤدێرییا ژینگەهێ و پاڤژیا وێ دکەن.

**راهێنان:**

١- مامۆستا دێ بۆ قوتابییان بەحسێ پێکهاتی و توخمێن ژینگەهێ کەت و دێ داخوازێ ژ هندەکان کەت، کو کارێ هەر توخمەکی و سوودێ وی دیارکەن.

٢- ڤان ڤالاتییێن خوارێ ب پەیڤێن گونجایی تژی بکە :

أ- .......... هەمی بوونەوەر ب جوانترین شێواز ئافراندینە.

ب- بێـهـنا ............ بێنخووش بوو .

ج- .......... بناخەیا ژیانێیە.

**چالاکی:**

قوتابی دێ وێنە و پەیکەرێن هندەك پێکئینەران یان توخمێن ژینگەهێ خرڤەکەن و دێ بەرانبەری هەڤالێن خوە بەحسێ وان کەن.

## وانەیا سێزدەیێ

# هاریکاری



مێرییا بچووك ب سەرێ دارەكا بلندڤە ما هلاویستی و د ناڤ شیراڤا چەقەكێدا ما ئاسێ و نەشیا بێتە خوارێ، عێجز بوو و كرە گری، و دەمێ هەڤالێن وێ مێشێن هنگڤینی وتەڤنپیركان و كولی و پەلاتینكان دەنگێ وێ بهیستین، ب لەز بەر پێ چوون دا هاریكارییا وێ بكەن.

كولی گۆت: دێ تە دانمە سەر ملێ خوە و تە ئینمە خوارێ، بەلێ مێرییێ نەڤیا ترسیا نە كو بكەڤت.

و مێشا هنگڤینی گۆت: وەرە سەر پشتا من، دا تە بینمە خوارێ ، بەلێ دیسا ترسیا و ل بەر نەهات. هەمییان پێكڤە هزرا خوە كر ، دا هاری هەڤالا خوە بكەن ، تەڤنپیركێ ژ نشكەكێڤە كرە هەوار و گۆت: دێ داڤەكا تەڤنێ خوە بۆ درێژ كەم بلا پێڤە بێتە خوارێ، هەمییان كەیفخوەشییا خوە دیاركر بۆ ڤێ هزرێ، و مێرییێ سوپاسییا وان كر ل سەر ڤێ هاریكارییێ . و ژ وێ ڕۆژێ هەمییان پێكڤە بڕیار دا كو هاریكارییێ بكەنە درووشمێ خوە، چونكی ئەو بناخەیا سەركەڤتنێیە.

# بزاڤ و چالاكی

دێ هزرا خوه كەم

بۆچی مێری ما ل سەر چەڤێ دارێ؟





# پاقژی



پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت :

## (تَنَظَّفُوا فأَنَّ الإِسْلاَمَ نَظِيفٌ)

## ( خوە پاقژ بکەن ، ئیسلام یا پاقژە )

تارا و سەلام و سازان د گەل دەیبابێن خوە ل سەر مێزا نانخوارنا نیڤرۆ ڕوونشتی بوون . دایکا تارایێ گۆت: زارۆکێن من ، بەری ئەم دەست ب خوارنێ بکەین، دێ چ کەین ؟

خووشکا مەزن تارایێ گۆت : دێ دەستێن خوە باش شۆین.

بابێ وێ گۆت: ئافەرین کچا من ، ئینا هەمی ڕابوون دەستێن خوە  شووشتن پشتی هنگی زڤڕینەڤە سەر مێزێ ، و پشتی خوارن بەرهەڤ بووی، بابێ گۆت: بسم الله، و هەمییان ل دووڤ ڤەگێڕا . و وەختێ ژ خوارنێ ب دووماهی هاتین هەمییان سوپاسییا خودێ کر، و دەستێن خوە شووشتن و ددانێن خوە ژی ب فرچە و مەعجوونێ شووشتن.

سازانێ پسیارا برایێ خوە سەلام کر: ڕێڤەبەرێ قوتابخانەیێ ئەڤرۆ سپێدەیێ ل گۆڕەپانا قوتابخانەیێ چ گۆت برا؟ ( ژ بەر کو ئەو سپێدەیێ یا نەساخ بوو نەچوو بوو دەوامێ).

سەلام بەرسڤ دا : ڕێڤەبەری ئەم شیرەت کرین کو ئەم جهێ خوە و جلکێن خوە و خوارنگەهێ و قوتابخانەیێ پیس نەکەین، و لیژنەیەك پێکئینا ژ قوتابییان، دا هەڤالێن خوە شیرەت بکەن و تێ بگەهینن، و مامۆستایەکێ خەتخوەش تەکلیف کر کو ڤان شیرەتان بنڤیست و ب دیواریڤە هلاویست.

ئەم هەمی کەیفخوەشبووین و مە پەیمان دایێ کو ئەم پێگیرییێ ب پاقژییێ بکەین، چونکی ئەو ژ باوەرێیە و ئێکە ژ هۆیێن تەندورستی و لەشساخییێ.

## چالاکی و ڕاهێنان

١-مامۆستا دێ داخوازێ ژ قوتابییان کەت کو ئێك ژ وان بەحسێ پاقژییا ددانان بکەت وەك جهئینان ل پێش چاڤێن قوتابییان ب ئامادەکرنا(فرچە و مەعجوونێ) بێتە کرن.

٢- فەرمۆدەیەکێ یان هۆزانەکێ ل سەر پاقژییێ بۆ قوتابییان بێژە.

٣- هندەك نیشان ب سینگێ سێ ژ پاقژترین قوتابییانڤە بێنە کرن ، دا ببتە هاندان بۆ ئەڤێن دی ژی کو خوە پاقژ بکەن و بەردەوام ئەڤ کارە د گەل قوتابییێن پاقژ بێتە کرن.

## وانەیا پازدەیێ

# ڕەوشتێن نانخوارنێ



ڕۆژەکێ هەڤالا من خانزادێ ئەز داخواز کرمە فراڤینێ ل مالا خوە و ئەز ژی ڕازی بووم ب داخـوازا وێ،پشتی ئەز گـەهشتیمە مالا خانزادێ، من سـێ جاران هێدی دەرگەهـ قوتا ، خانزادێ بۆ من دەرگەهـ ڤەکر و من سـلاڤ کـرێ : (السلام عليكم ورحمـه الله ) و وێ سـلاڤا من ڤـەگێڕا و گۆت : ( وعليك السـلام ورحمـه الله وبركاته) و ژ من خواست ئەز بچمە ژۆر، و ئەز چوومە ژۆرڤە و ئەم ڕوونشتـین و ئەم ئاخڤتین. دەمێ وەختێ خوارنێ هاتی، ئەز و هەڤالا خوە چووینە سـەر مێزا خوارنێ، و برایێ وێ سامان هاتە د ژۆرڤە و ڕوونشـتە سەر مێـزێ بێـی کو دەستێن خوە بشۆت ، و دەست ب خوارنێ کر ، و گۆتە خـووشکا خوە من گەلەك ژ ڤێ و ئەوا هە دڤێت...

هەڤالا من مەندەهۆش ما ژ ڕەفتارێ برایێ خوە و نەمازە دەمێ د بەر خوارنێڕا دئاخڤت و پرتکێن خوارنێ ژ دەڤی دفڕین، و پشتی خوارنا خوە تەمامکری ، ل سـەر کورسیکی بەرانبەر تەلەفزیۆنێ ڕوونشت، دا بەرێ خوە بدەتە بەرنامەیەکی وەرزشی.

## بزاڤ و چالاكی :

ئەرێ ڕەفتارێ سامانی یێ دورست بوو ؟

ئەگەر تو ل جهێ وی بایی دا چ كەی؟

ئەرێ تو دشێی هندەك ژ ڕەوشتێن خوارنێ بهەژمێری ؟

ئەز زارۆكەكم : ڕەوشتێن خوارنێ و ڤەخوارنێ ب جه دئینم ؟



دەستێن خوە بەری خوارنێ دشۆم




بەری دەست ب خوارنێ بكەم دبێژم :

بسم الله



دێ خوارنێ باش جووم و بێ دەنگی ژ دەڤێ خوە بینم



ب دەستێ ڕاستێ دێ خوم



دێ خوارنێ ژ بەرێ خوە خوم



پڤ ناکەمە خوارنا گەرم و ئەز دێ خوە لێ گرم هەتا سار دبیت.



ئەز چو خوارنێ د ئامانێ خوەدا ناهێلم



دەمێ ئەز تێر دبم دێ بێژم : سوپاس بۆ خودێ، ئەوێ خوارن و ڤەخوارن داییە مە و ئەم کرینە موسلمان.



پشتی خوارنێ دێ دەستێن خوە شۆم و دەڤ و ددانێن خوە دێ پاقژکەم ژ پاشماییێن خوارنێ و دێ پارێزگارییێ ژ ساخلەمییا وان کەم

**مفایەك :**

دەستێن خوە بەری و پشتی خوارنێ دێ شۆم . بەری خوارنێ ناڤێ خودێ دێ ئینم و دێ سوپاسییا وی کەم دەمێ ئەز تێر دبم ، دێ جوان خوارنێ جووم و چو خۆارنێ د ئامانێ خوە دا ناهێلم.



**دوعا :**

**خودێوۆ تو بەرەکەتێ بێخییە وی دەرامەتێ تە دایییە مە، و ژ وی باشتر ب ڕزقێ مە بکە.**

**ڕاهێنان**

**١- نیشانا ( ڕاست ) بەرانبەر .وێنەیێ ڕاست و نیشانا ( خەلەت ) بەرانبەر وێنەیێ دەربڕینێ ژ ڕەفتارێ خەلەت دکەت دانە :**





**٢- ڤان ڕستەیان ب جوانی ڕێز بکە :**

**( ) پشتی هنگی دێ دەست و چاڤێن خوە شۆم ( )پاشی دێ خوارنێ خوم**

**( ) وەختێ ژ قوتابخانەیێ دزڤڕم دێ جلکێن خوە ژ بەر خوە کەم ( ) دێ ناڤێ خودێ ئینم.**

# سەرەدانەك د گەل باپیرێ من



ئەز د گەل باپیرێ خوە چوومە مالا خالێ خوە ئیبراهیم
وەختێ باپیرێ من ڕوونشتی سۆرەتا فاتحێ خواند ، چونکی مامێ من کچخالا من بۆ کوڕێ خوە خواستبوو. من پسیارا باپیرێ خوە کر، کا بۆچ ئەو سۆرەت خواند .

**باپیرێ من گۆت:** شوان سۆرەتا فاتحێ دەستپێکا قورئانێیە ، ژ بەر هندێ د ڤان هلکەڤتاندا دئێتە خواندن،دا ببتە دەستپێکەکا خێرێ.

**من گۆتە باپیرێ خوە:** ئەز دێ ڤێ سۆرەتێ ژ بەرکەم.

**باپیرێ من گۆت:** ئافەرین کوڕێ من.

# سوٚرەتا فاتحێ

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١
ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢
ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤
إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ٱهۡدِنَا
ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ
عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ
وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧



## مفایەك

د هەمی نڤێژاندا سۆرەتا فاتحێ دئێته خواندن، چونکی ئەو دەربڕینێ ژ سوپاسکرنا خودێ دکەت ل سەر ڕاستەڕێکرنێ.

## چالاکی:

- پێکۆلێ بکە وەکی شوان ڕژد بی و سۆرەتا فاتحێ ژ بەر بکەی.

-د گەل هەڤالێن خوە بەحسێ هندەك ژ وان خوەشییان بکە، ئەوێن خودێ داینە مرۆڤی.

## دوعا :

خودێوۆ سوپاس بۆ تە ل سەر وان کەرەم و خوەشییێن تە داینە مە.

## پێزانینەك:

ئێکەمین ئایەتا قورئانێ بۆ پێغەمبەری ( سلاڤ لێ بن ) هاتی ، د شکەفتا (حراء) و د شەڤا (لیله القدر) دا هاتە خوار.

## ڕاهێنان:

ڤان ئایەتان ب جوانی ڕێز بکە :

( ) الرحمن الرحیم ( ) ایاك نعبد وایاك نستعین

( ) مالك یوم الدین ( ) الحمد لله رب العالمین

# خودایێ مە ئێکە



وەختێ پێغەمبەرێ مە موحەمەد ( سلاڤێن خودێ لێ بن) داخوازا پەرستنا خودایێ تاك و تەنیا دكر .

كافران پسیار ژێ دكر : كییە خودایێ تە یا موحەمەد ؟

سۆرەتا (الاخلاص) هاتە خوارێ دا بەرسڤا كافران بدەت.

## سۆرەتا الاخلاص ( التوحيد )

بسم الله الرحمن الرحيم

قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ
يُولَدْ ٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ٤

((صدق الله العظيم))

### مفایەك

پێغەمبەری( سلاڤ لێ بن) ئەم شیرەت کرینە کو ئەم سۆرەتا (الاخلاص) گەلەك بخوونین چونکی خێرا خواندنا وێ هەمبەری سێ پشکێن قورئانێیە.

### چالاکی:

– هندەك خاسیەتێن دورستکەرێ مە بێژە .

### دوعا :

خودێوۆ ل گونەهێن مە و دایبابێن مە و هەمی باوەرداران ببۆرە ڕۆژا دووماهییێ.

### پێزانینەك:

سۆرەتا (الاخلاص) دبێژنێ سۆرەتا (التوحید) ژی.

### ڕاهێنان:

١– ئەڤان ئایەتان ب ڕێزکرنەکا دورست ، ڕێز بکە :

| | |
|---|---|
| قل هو الله أحد | لم يلد |
| الله الصمد | ولم يولد |
| ولم يكن له | كفواً أحد |

٢– سۆرەتا (الاخلاص) ژ بەر بێژە.

# هەمی مین و تەقەمەنی مرۆڤان دکوژن یان بریندار دکەن






